# گەنجی تۆبەکار

## ڕوداوێکی ڕاستەقینەیە

### نامەیەکی فەیسبووك گەنجێك لە زینا دەپارێزیت

نووسین و ئامادەکرنی: کرێکار قادر ڕوستایی
نەخشەسازی و پێداچوونەوە: م.ئاوارە محمدامین کەوەرتی

# ناسنامەی نامیلکە؛

- ❖ ناوی نامیلکە: گەنجی تۆبەکار
- ❖ بابەت: چیرۆکی ڕاستەقینە
- ❖ نووسینی: کرێکار قادر ڕوستایی
- ❖ نەخشەسازی و پێداچوونەوە: م. ئاوارە محمدامین کەوەرتی
- ❖ کاتی نووسین: ٢٠١٩/٠١/١١
- ❖ کاتی پێداچوونەوە: ٢٠١٩/٠١/١٤

## ✍ پێشکەشە بە:

☜ سەروەر و سەرکردە و پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێت) .

☜ بە ڕۆحی باوکی ڕەحمەتی و هەمیشە لەیادم و دایکی ئازیز و خۆشەویستم.

☜ بە هاندان و هیمەتی برا ئازیزەکانم و خوشکە خۆشەویستەکانم.

☜ پێشکەشە بە بەڕێز مامۆستا ئاوارە محمدامین کەوەرتی ئازیز و خۆشەویست .

☜ بەو مامۆستایانەی لە ژیان فێری ئەلیف و بێی خوێندنیان کردم .

☜ هەروەها گشت ئەو هاوڕێ و خزم و دۆستانەی لەژیان هاندەرم بوون و یارمەتیدەرم بوون بۆ فێربوونی زانست و زانیاری بەسوود.

بسم الله الرحمن الرحيم

لقد جاءكم رسول من أنفسكم
عزيز عليه ما عنتم حريص عليكم
بالمؤمنين رؤوف رحيم فإن تولوا فقل
حسبي الله لا إله إلا هو عليه توكلت
وهو رب العرش العظيم

سورة التوبه 128-129

**هۆشمەند:** گەنجێکی دیندار و سەر ڕاست و ڕاستگۆیە، خواناسێکی دڵسۆز و لەخوا ترسە، مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و چاکەکار و بانگخوازە.

ڕۆژێك لەگەڵی کەوتمە گفتوگۆ و قسە کردن و پرسیارکردن، لێرەدا دەقی گفتوگۆکە بۆتان باس ئەکەم.

**کرێکار:** ئەوە بەچی خەریکی برای ئازیزم؟

**هۆشمەند:** خوێندنم تەواو کردووە دانەمەزراوم، لەدوکانێك بە شاگردی کاردەکەم و مانگانەکەم ٤٥٠ هەزار دینارە.

شەوانەش زۆربەی کات خەریکی خوێندنەوەی پەرتوکی دینی و لەبەرکردنی قورئانم. دواتر پشوویەك وەردەگرم و گەڕانێك بەناو تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکدا دەکەم کەپەڕەیەکی گرینگە لەم سەردەمەدا زۆرێ لەخەڵکی بەهەموو چین و توێژەکانیشەوە سەرقاڵن بە فیسبوك و کاتی خۆی لەگەڵ بەسەردەبن، لەم سۆنگەیەشەوە منیش ئەوەم بەدەرفەت و رێگایەك وەرگرتووە بۆ دەعوە و بانگەوازی کردن بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەر شتێکی بەسوود لە بواری (ئاینی، ڕەوشتی، وتاری ماموستایان، ئامۆژگاری زانایان) لەهەر ڕوانگەیەکەوەبێت لەم پەڕەیە بڵاوی دەکەمەوە.

**کرێکار:** ئەی باشە هەست ناکەیت زۆر کاتت دەفەوتێنێ؟

**هۆشمەند:** بەڵێ بێگومان، بەڵام من لەبەر یەك شت ئاوا هۆگری بوویمە!

**كرێـكـار:** ئەو شتە چییە، ئەی هۆكار چییە هێندە پۆست بڵاودەكەیتەوە لەفیسبوك؟ ئایا كاریگەری هەیە؟ چونكە لەئێستادا خەڵكی زۆربەیان خەریكی كات كوشتنن و ئەتاری و یاری كردنن؟

**هۆشمەند:** سوێند بەخوای گەورە ئەوەی منی ئاوا گەرم و گوڕكردووە و بەردەوام بم و كۆڵنەدەم هەرخەریكی بڵاوكردنەوەی نوسینی ئاینی و وتاری كاریگەر و پەند و ئامۆژگاری و وتەی بەنرخی زانایان بم لەبەر ئەم هۆكارە سەرەكیەیە كە بۆتی باس ئەكەم؛

... شەوێك لە شەوان، كاتەكەی درەنگ بوو سەیری ئەرشیڤی نوسینەكانی خۆمم دەكرد، ویستم نوسینێك پۆست بكەم و كە كاریگەری هەبێت. لەو كاتەدا گەڕام نوسینێكی زۆر كاریگەر و پڕ مانام لابوو ویستم پۆستی بكەم، كە باسی مردن و سزای ناو گۆڕ و ئاگری دۆزەخ و توڕەبوونی خوا لەبەندەكانی دەكرد. هەتا بڵێی نوسینێكی كاریگەر و جوان بوو، وشەكانی ناوی وەك بۆنی مسك بوون و دەچوونە قوڵایی ناخ و دەروونی هەموو مرۆڤێكی ویژدان زیندوو و پڕ لەئیمان،

ئیدی منیش پێش پۆستکردنم هەستام لەچات بە نامە بۆ سەرجەم هاوڕێکانم نارد...

بۆ بەیانی لەخەو هەستامەوە نوێژی بەیانیم کرد، سەیرێکی فیسبوك کرد، بینیم کەسێك بە ناوی (ئـــایــنـده) نامەیەکی دوور و درێژی ناردبوو، دەست خۆشی لێم کردبوو، لەکۆتاییەکەی نوسیبووی گەر کاتت هەبێ من دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم؟ منیش وەڵامی نامەکەیم دایەوە و پێم وت فەرموو لەخزمەتتدامە.

بۆ شەوەکەی لەدوایی نوێژی عیشا لەسەر هێڵ بووم لەفیسبوك لەو کاتەدا زەنگێکم بۆ هات کە دەبینم هەمان ئەو کەسە(ئـــایــنـده) کەداوای لێکردبووم قسەم لەگەل بکات. منیش وەڵامم دایەوە، وتم بەڵێ فەرموو برای ئازیزی من.

ئـــایــنـده: سڵاو برا گیان باشیت تەندروستیت چۆنە.

هۆشمەند: سوپاس بۆ خوا برای ئازیزی من، ئێوە چۆنن بمبورە کەوا دوێنێ شەویش نوسینێکم بە نامە بۆناردی هەراسانم کردی، خەجاڵەتم.

ئـــایــنـده: نا نا براگیان و الله زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە ئەو نامەیەی تۆ منی گەڕاندەوە لەخراپە و تاوان و گوناح!

هۆشمەند: چۆن بوو کاریگەری هەبوو لەسەر تۆ دەتوانی پێم بڵێی؟

**ئـايـنـدە:** بەڵێ پێت دەڵێم، بەو مەرجەی ناوی من تا قیامەت بپارێزی و باسی نەکەیت. هەر چەندە من لێتەوە دوورم و بەس دەبێ ناوی من نهێنی بێت گەر ویستت بۆ خەڵكی بیگێڕیتەوە.

**هۆشمەند:** سوێند بە خوای گەورە ناوت ناهێنم، بەس بۆ پەند و ئامۆژگاری و وانە وەرگرتن بەبێ ناو هێنانی تۆ بەناوی خوازراوەوە باسی دەکەم و دەیگێڕمەوە بۆ خەڵكانی تر.

**ئـايـنـدە:** زۆرباشە، خۆت ئەزانیت من لەدەرەوەی وڵاتم، لە ژوورێكی باڵەخانەیەك بە تەنیا ئەژم، وەك دەم بینی گەنجێكی قۆزم، نوێژ ناكەم و هەموو گیانم بۆنی گوناح و تاوانی لێدێت، ئەو شەوە كاتێ نامەكەت نارد بەتەنیا لەژوورەكەم دانیشتبووم، ئافرەتێكی ئەورووپیش بە ناوی (لـيـزا) كە پیشەی مامۆستای قوتابخانەیە و لەژوورەكەی بەرامبەرم بە تەنیا ئەژیت، هاوڕێمە چەندین جار بەیەكەوە خەوتووین وەك ژن و مێرد هەڵسوكەوتمان كردووە. پێش ئەوەی نامەكەی تۆم بەدەست بگات لە پلانم بوو بچم بۆلای (لـيـزا) و لەگەڵی ڕابوێرم و سێكسی لەگەل بكەم، بەڵام كاتێ نامەكەتم بۆهات، هەمووییم خوێندەوە، لەو ساتەدا ترسێك بەناخی دڵمدا هات و زۆر بێ توانابووم، یەكسەر دەرگای ژوورەكەم داخست، مۆبایلەكەم داخست نەوەك ئەو

مامۆستایە (لــــیــــزا) زەنگم بۆ لێبدا، بە هەستێکی پڕ لە تاوانەوە لە ناخەوە دەگریام، وێنەی ناو گۆڕ و کفن و سزا و هەموو شتێکی سامناکم دەهاتە پێش چاو، بەپەلە چووم بۆ گەرماو و خۆمم شوشت و غوسڵم لە خۆم دەرکرد، دوای هاتنە دەرەوە و ڕوو لە ئاسمان دەپاڕامەوە و هاوارم دەکرد خوایە تۆبە بەس ئەم جارە نەم مرێنێ، تۆبە خوایەگیان. بۆ بەیانی چوومەوە سەر کاری خۆم کەسێکی دیندار و بە ڕەوشتم لەگەڵدایە بە ناوی (ئـــاســـۆ) کە بە تەمەن لەمن گەورەترە و لە ڕێستوراِنتێك بەیەکەوە کاری پاکردنەوە دەکەین. پێم وت (ئـــاســـۆ) بۆ نوێژی نیوەڕۆ منیش لەگەڵ تۆ دێم بۆ مزگەوت دەمەوێ تۆبە بکەم و بگەڕێمەوە لای خوا؟ (ئـــاســـۆ)پێکەنی و نێوچاوانی منی ماچ کرد.

دوای وەرگرتنی مۆڵەت لە خاوەنی ڕێستورانتەکە بەیەکەوە چووین بۆ مزگەوت، لەگەڵ چوونە ژوورەوەمان خۆشیەك بە گیانمدا هات و تەزوێکی ئیمانی بەناخ و دڵمدا ڕۆچوو و زۆر بەختەوەربووم. (ئـــاســـۆ) منی ناساند بە برادەرەکانی کە هەموویان کەسانی دیندار و خواناس بوون هەر ئەوکات دەرسێکی قورئانیان بۆم دانا، وتیان شەوان وەرە بۆلامان، منیش بەڵێنم پێدان کە پابەند ئەبم بە کات و وانەکان.

لەو كاتەوە كە بڕیاری تۆبەكردنم بەڕاستی و دروستی داوە، سوێند بەخوا بەڵێنم داوە كە نەگەڕێمەسەر گوناح و تاوانەكانی پێشوو.. بە ڕاستی زۆر دلخۆشبووم، بەڕاستی ئەو نوسینەی تۆ بووە هۆكاری گەڕانەوەی من بۆ لای خوای گەورە، بۆیە نزا لە خوای گەورە دەكەم كە پاداشتت بە خێرت بداتەوە برای ئازیزی من.

**هۆشمەند:** برا دوعام بۆ بكە من خزمەتكاری ئەم دینە پیرۆزەم و لەخزمەتی تۆش دام هەر كارێكت هەبێت.

**ئـــایـــنـــدە:** دڵنیابە دوعات بۆ دەكەم، تۆش دوعام بۆبكە پیاوی چاك و برای ئازیزم.

دواتر ماڵئاوایمان لەیەكتری كرد....

خودا حافیز و خوا ئاگادارت بێت....

دوایی تیپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر ئەو گفتوگۆیەمان، **ئـــایـــنـــدە** وێنەیەكی ناردەوە لەگەڵ برادەرەكانی لەناو مزگەوت بوو، نووسیویەتی سەرقاڵی وانەی ئاینی و خوێندنی قورئانی پیرۆزین، هەموو نوێژەكانم بەكۆمەڵە و لەگەڵ هاوڕێكانم و برادەرانم نیازمانە سوونەتی عومرەش بەجێبگەیەنین.

**کرێکار:** **لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە؛** ئەوەیە کاریگەری نیەتی بۆ خوابوون، ئەوەیە کاریگەری بڵاوکردنەوە و نووسینی بابەتی ئاینی و بەسوود و وتاری مامۆستایانی ئاینی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فیسبوك. بۆیە دەبێت وریابین لە بەکارهێنانی دەزگا و ئامێرەکان، چونکە ئەگەر لە پێناوی ئاینی پیرۆز و خوای گەورە دابێت ئەوا بۆمان ئەبێتە تێشووی ڕۆژی دوایی و کلیلی ڕزگاربوونمان و گەیشتنمان بە بەهەشت.

**خـوایـەگیان؛** بەنووری خۆت هیدایەتمان بدەیت بۆ ڕێگای ڕاست و یارمەتیمان بدەیت بۆ سەرخستنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

تێبینی: ناوەکانی (هۆشمەند ، ئـایـنـدە ، لـیـزا ، ئـاسـۆ) ناوی خوازراون.

ژانـەر: چیرۆکی ڕاستەقینە

نوسینی: کـرێـکـار ڕوسـتـایـی

پێداچوونەوە و ڕێکخستنی: م. ئاوارە کەوەرتی

ڕۆژ/ دووشەممە

ڕێکەوتی/ ١٤-٠١-٢٠١٩

کات/ ٣ی تەواو